ناوەندی ڕەها
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

# خۆت بە



نووسینی:
لەمیا ئیبراهیم

وەرگێڕانی:
نێچیروان وەلی




**Kteb Xana کتێـــبخانـــه**

public channel

Description

کتێبخانەیەک تایبەت بە زیاتر فێربونو کاراکردنی عەقڵ و دورکەوتنەوە لە نەزانین و رەشبینی. 

هۆشیاری ڕۆشنبیری تاک لە کۆمەڵگە.
پەرەپێدانی ڕۆشنبیری تاک.
گەشەپێدانی هزری تاک.

@haval_pashaie10

ئـەکاونـتـەکانـم ✓ 

https://linktr.ee/havalpashaie

t.me/kteb_khana

Invite Link



Notifications

On

TapScanner



ناوەندی ڕەها
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە


بەڕێوەبەری گشتیی
ناوەند: زامدار قادری

بەڕێوەبەری چاپ و
بڵاوکردنەوە: ئـ








هەولێر، بازاڕی ڕۆشنبیری، تەنیـ
+964 750 406 6674
ndi Raha / ناوەندی ڕەها




# خۆت بە

نووسینی:

لەمیا ئیبراهیم هوەیمل

وەرگێڕانی:

نێچیروان جاسم وەلی

چاپی یەکەم

((مێشک باشترین سینەمایە لە جیهاندا، ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کاتێک کتێبێکی باش دەخوێنیتەوە.))

پێدلی سکۆت

## پێرست


پێشەکی.......................... ١٠

زەردەخەنە............................ ١٣

متمانەت بە خەونەکانت هەبێت................ ١٥

بەگوێرەی توانات هاوکار بە.................. ١٨

خۆشەویستی............................ ٢١

کۆڵ مەدە.............................. ٢٤

جیاوازییەك بهێنە ئاراوە...................... ٢٧

بەختەوەری............................ ٢٨

بەربەستی هەرە گەورە لە ڕێگەتدا................... ٣٠

قسەی خەڵك بۆ ئێمە هیچ نییە................... ٣٢

هاوەڵانی دڵم........................... ٣٥

ئیلهامبەخشان............................ ٣٨

مافی ئەوەت خراپ سوود لە هەستەکانم وەربگریت!............ ٤١

له گرنگیی خۆت کەم مەکەوە........................................٤٣
گەشتی سەرکەوتن........................................٤٥
سکالاَ مەکە........................................٤٨
من کێم؟........................................٥١
پەیام........................................٥٣
ئامۆژگارییەك له دڵەوە........................................٥٥
ژیان بەوجۆره نییه........................................٥٧
بەتەمەنەکان........................................٦٠
بەتەنیا تۆ........................................٦٢
خەڵك دەمارگرە؟........................................٦٤
ئێوە گەورەن........................................٦٦
قەناعەتت هەبێت........................................٦٨
بەڵێ دەتوانیت........................................٧١
وزەی ئەرێنی........................................٧٣

ڕۆژێك دێت......................................... ٧٦

هەڵمەچۆ............................................ ٧٨

هەموو شتێك دەبێت.................................... ٨١

داوای لێبوردن........................................ ٨٣

ناتوانیت............................................. ٨٦

ئێمە لەسەر حەق نین.................................. ٨٨

نیشتمان............................................. ٩٠

خاوەن شوێن دەست بە................................. ٩٣

بۆ تۆ................................................ ٩٥

# پێشەکی

خۆت بە، وا بە کە دەتەوێت وا بیت، وا بە وەک ئەوەی دەیبینیت ئەمە پێویستە وا بێت، بەو جۆرەی تۆ پێی ڕازیت.

نە لە شیانی خۆت کەم بکەوە نە لە توانای خۆت، بزانە تۆ دەتوانیت زیاتر ئەنجام بدەیت، تەنیا هەلێک بە خۆت بدە بۆ کردنی کارێکی ئەستەم..

((خۆت بە کۆپیی جگە لە خۆت مەبە))

لێرەدا لە کتێبەکەمدا هەموو هەستەکانم لە نووسیندا لەبارەی دڵتەنگی، شادی، دڵنیایی، پەشیمانی ..دەخوێننەوە. هەوڵم داوە ئەوەتان پێ ڕابگەیەنم، چۆن لەو شتانەی، کە ڕووبەڕووم بوونەوە فێربووم، ئەمە مانای ئەوە نییە ڕێگەکەم ڕاستترینە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەکەم ڕاستە.

من لەمیا ئیبراهیم هەویمل، لە تەمەنی دە ساڵییەوە دەستم بە نووسینی دێڕەشیعر و بیرەوەری و ڕۆمان.. کردووە، بەڵام ئەمجارە بڕیارم دا هەمووان ئەوە بخوێننەوە، کە نووسیومە. لەو کاتەوەی دەستم بە خوێندنەوەی کتێب کردووە، فێربووم و گومانم لەوە نەبووە یەکێک لە شێوازەکانی پەروەردەکردنی تاک خوێندنەوەیە. هەموومان لەسەر ئەوە کۆکین دایک و باوک بناغەی پەروەردەن، بەڵام کتێب د



خوێندنەوەش بابەت دەخەنە ڕوو، زانیاری دەگەیەنن، ئامۆژگاری پێشکەش بە کەسوکارمان دەکەن، لەبارەی ئەو گرفتانەی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە و دەکرێت لە کۆمەڵگەکانماندا ڕووبەڕووی ئێمەش ببێتەوە.

لە کۆتاییدا کتێبەکەم پێشکەشی گرنگترین ئەو کەسانە دەکەم، کە بە ژیانمدا تێپەڕیون، بە ئەوانەی بە هەبوونیان پەنجەمۆرێکی دیاریان هەبووە، وای کردووە من ئێستا بەو جۆرە بم.

دیارییە بۆ دایك و باوکم ئەوان بناغەی سەرکەوتنمن، بنچینەی کەسایەتیی ئێستامن. ئەو کەسانەی بە درێژاییی ژیان زۆر شانازییان پێوە دەکەم، ئەوان پاڵەوانی منن و دەبمە شانازی بۆیان ( بە ویستی خوا) دەسا خوایە بیانپارێزە بۆم. داپیرم بناغەی پەروەردەمە، هۆکاری خەندەمە، چونکە کەسێکە سەرنجی دڵتەنگیم دەدات بێ ئەوەی بدوێت. بە کورتی دایکێکی ترمە، لەبەر ئەوەش خۆشویستنێك خۆشم دەوێت بە خەیاڵی کەسدا نەهاتبێت!

براکانم لە یەکەمین هاندەرەکانمن بۆ هەر هەنگاوێك هاویشتوومە، ئەوان یەکەمین کەسانێکن شتگەلی زۆریان لێوە فێربووم لە ژیاندا.. ئەوان ئازیزانی منن، ئەوان یەکێکن لە هۆکارەکانی سەرکەوتنم، بزانن ئێوە بەهادارترینی منن.





دەستە خوشکەکانم، ئەوان گەورەترین پاڵپشتی منن، لەگەڵیاندا بە هەموو لایەکدا چووم، کە هەنگاو بە هەنگاو نووسیومە، ئەوان هاوڕێی دڵمن، ئەو خوشکانەن، کە لە دایکم نەبوون.

هەندێك لەوانەی هۆکارێك لە هۆکارەکانی چاپکردنی ئەم کتێبە بوون، حیسە عەجمی و عالیە ئومێر، قسە پاڵپشتکارەکانتانم لەبیرناچێت، کە وایان لیّ کردم زیاتر لە دەستکەوتەکانم متمانەم بە خۆم هەبێت، ڕادەی ئەو دڵگەرمییەتانم بەرانبەرم لەیاد ناچێت.. زیاتر دڵگەرمی کردم! سوپاس.

لە دوماهیدا پێش هەموویان، ئەو خۆی ویستی ئەنجامی بدەم و ئەنجامم دا، ئەو خۆی ویستی سەر بکەوم.. ئەو خۆی گەورەترین پاڵپشتمە، ئەویش خوای توانا و شکۆمەندە، هیچ شتێك بیّ ویست و ڕەزامەندیی ئەو ڕوو نادات.

لە کۆتاییدا بیّ جیاوازی، سوپاس بۆ هەریەکێك لە ئێوە، کە کاتی خۆتان بۆ خوێندنەوەی کتێبەکەم تەرخان دەکەن، ئەمە بۆ من زۆر دەگەیەنێت، بزانن ئێوە هۆیەکن لە هۆیەکانی سەرکەوتنی کتێبەکە، سوپاسی زۆر بۆ هەموو ئەوانەی دەستیان لە هاتنە ئارای ئەم کتێبەدا هەبوو.



# زەردەخەنە

بڕیارم دا ببێتە یەکەم بابەتم، چونکە زەردەخەنە لای خوا و خەڵکیش شتێکی گەورەیە.

((زەردەخەنە بە ڕووی براکەتدا چاکەیە))

زەردەخەنە چارەسەرییەکە بۆ هەموو نەخۆشییەك، هەمووان لەسەر ئەوە کۆکن. چەند جوانە زەردەخەنە بە ڕووی ئەوانەدا بکەیت کار دەکەن! باری دەروونییان دەگۆڕێت، بە دڵگەرمییەوە بۆ کارکردن دەگەڕێنەوە.

جارێکیان لە فڕۆکەخانەی جەدە چووم بۆ توالێت و لەو کاتەدا ئافرەتێك هاواری دەکرد و بانگی ئافرەتێکی کارگوزاری دەکرد:

((ئێستا پاکی بکەوە دەمەوێت بچمە ژوورەوە))، ئافرەتە کارگوزارەکە ئافرەتێکی بەتەمەنی دوور لە وڵات و منداڵەکانیەتی، تا داهاتێکیان بۆ پەیدا بکات. کاتژمێرەکانی کارکردن زۆر درێژن و ئەو بڕە پارەیەش بەرانبەر ئەو ماندووبوونە نییە. ئافرەتە کارگوزارەکە گوتی: ئێ خۆ نان ناخۆم، چاوەڕێ بکە، تا کارەکانم تەواو دەکەم، پاشان چیت دەوێت وا دەکەم.





Scanned by TapScanner

بەلأم ئافرەتەکە وەلأمی دایەوە: ((بۆ من گرنگ نییە! ئێستا وەرە ئەوە بکە، کە دەمەوێت، پاشانیش ئەوە بکە، کە دەتەوێت))، نازانم، بەلأم خۆم لە جێگەی ئەو ئافرەتە کارگوزارە دانا، کە دەکرێت واز لە هەموو شتێك بهێنم و دەست بەر بدەم و بچم بگریم! بەلأم ئەو بێدەنگ بوو و ئەو کارەی کرد، کە فەرمانی پێ درابوو، دەستم لە سەرشانی دانا وەك ئەوەی پێی بلێم تۆ تەنیا نیت، زەردەخەنەیەکم بۆ کرد.

لەو کاتەدا گومانت نەبێت چەند جوانە ئەو زەردەخەنەیەی لەو دۆخە دەبێتە پاڵپشتی کەسێك! لەبەر ئەوە ئەو ئافرەتە کارگوزارە زەردەخەنەی بۆ کردمەوە لەبری ئەو دڵتەنگییەی لێی چاوەڕێ دەکرا.

زەردەخەنە بۆ ئێمە و جگە لە ئێمە جوانە، دەکرێت یەکێك بێت لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی کەسێك، یەکێك بێت لە چارەسەرییەکانی کەسێك، یەکێك بێت لە هۆیەکانی پاشگەزبوونەوەی کەسێك لە بڕیارە هەڵەکانی.



# متمانەت بە خەونەکانت هەبێت

مەرج نییە هەمووان بە خەونەکانت سەرسام بن، مەرج نییە هەمووان قەناعەتیان پێی هەبێت، بۆیە ناومان ناوە خەون لەبەر ئەوەی بە خەیاڵی کەسدا نەهاتووە..

لە ناخمدا خەونگەلێکی زۆر هەیە و هەندێك لە خەونەکانم لەگەڵ داب و نەریتدا وێك نایەنەوە، ڕووبەڕووی زۆر ڕەخنە و گاڵتەپێکردن بوومەوە، لە قۆناغێکی تەمەنمدا گشت خەونەکانم لە مێشکمدا سڕیەوە و لەگەڵ قسەی خەڵکیدا ڕۆیشتم و قەناعەتیان پێ هێنام خەونەکانم زێدەڕۆییان تێدایە و ئەم خەونانە لەگەڵ مندا ناگونجێن، بەڵکوو بۆ پیاو یان بۆ کۆمەڵگەیەکی تر دەبێت!

لەو ماوەیەدا هەستم بەوە کرد هیچ نیم، کەسێکی بێ ئامانج، بێ خەون، بێ خولیا، بەوجۆرە بیر دەکاتەوە، کە خەڵك دەیانەوێت بیر بکاتەوە، جارێکیان گوێم لێ بوو بەوەی کەسانێك هەن ئاواتەخوازی شکستی کەسانی دەوروبەریانن و هەوڵ بۆ تێکشکاندنیان دەدەن، تاوەکوو وەك خۆیان بێ خەونیان بکەن! بڕوام بە ڕاستیی ئەو کارە نەدەکرد، پێم وا بوو کەس نییە ئاواتەخوازی شکستی کەسانی تر بێت، بەڵام هەڵە بووم! ئەوەی هەموو متمانەیەکم پێی هەبوو و کردمە هاوبەشی خەونەکانم، هەوڵی دا بە قسەی شیرینی فریودەر هەموو



خەونەکانم بکوژێت ! بەداخەوە قەناعەتی پێ هێنام و گشت خەونەکانم سڕییەوە و بوومە کەسێك وەك ئەو دەیویست. پاشان دەرکم بە کارەکە کرد و هەموو ئەوانەم فەرامۆش کرد، کە شکستی منیان دەویست.

خەونی گەورە ببینە.. خەونی چۆن ببینیت، بەوشێوەیە دەبیت.

قەناعەتهێنانمان بە خەونەکانمان وامان لێ دەکات بە هەموو هێزێکەوە بێ پاشگەزبوونەوە و گەڕانەوە بەرەو ڕوویان بڕۆین، دوای ئەوە بەوجۆرە دەبیت، کە دەتەوێت.



((تەنیا بەوەی لە دوای خەونێکی دیاریکراوەوە دەست بە هەوڵدان دەکەیت، ژیانت دەبووژێتەوە و هەموو شتێك مانا پەیدا دەکات.))

**باربارا شیر**

# بەگوێرەی توانات هاوکار بە

پێشکەشکردنی خزمەت بە هەر کەسێك هەستێکی جوانە، یارمەتیدانی کەسی بەتەمەن، یاریدەدانی منداڵ، یارمەتیدانی کەسی بێگانە، هەر یارمەتیدانێك بێت، مادام لەسەر بنەمای نیازباشی و هەستکردن بە لێپرسراویەتییە.

پێش ئەوەی خزمەتێك پێشکەش بکەیت پێویستە قەناعەتت بەوە هەبێت ئەو خزمەتەی پێشکەشی دەکەیت بۆ ئەوەیە تا هەست بە ئاسوودەیی بکەیت، ئەنجامی بدە و چاوەڕێی بەرانبەر مەکە، بەدڵسۆزییەوە خزمەتەکە پێشکەش بکە تا بە پێشکەشکردنی دڵخۆش بیت.

لەگەڵ بانگهێشتکردنێکی سادە، خەندەیەك لە دڵەوە، تەماشاکردنێکی سوپاسگوزارانە،

هەموو ئەو گوزارشتانە ماندووبوونی خزمەکەت بیر دەبەنەوە.

((یارمەتیی خەڵك دەدەم لەبەر ئەوەی وام لیَ دەکات هەست بکەم دەستکەوتێکم بەدەست هێناوە، لەبەر ئەوەی وام لیَ دەکات کەسێکی باشتر بم، وام لیَ دەکات زیاتر شانازی بە خۆمەوە بکەم)).



مەرج نییە هاوکاریکردنەکە گەورە بێت، چونکە هەر چەند بێت هەمووان پێویستییان بە خزمەت هەیە.



((بۆ دەستگیرۆییی ئایین و هونەر و خۆشەویستی ڕێگەی ژیان ڕووتەن و سەختە.))

**ئەلبێر کامۆ**

# خۆشەویستی

لقەکانی خۆشەویستی زۆرن، وات لێ دەکەن هەست بە دڵگەرمی بکەیت بۆ ژیان، هانت دەدەن بۆ جەنگان لە پێناویدا.

مەبەستم تەنیا خۆشەویستیی باوی نێوان دوو ڕەگەز نییە، بەڵکوو چەندان جۆری تری خۆشەویستی هەیە..

وەك خۆشەویستیی خوا

تاقی بکەوە خوات خۆش بوێت و لە کاتە سەختەکاندا باوەڕت پێی هەبێت، بە جۆرێك تۆ لە بەرزترین ئاستی داڕووخاندا بیت.

دەبێتە ڕێگە چارەی یەکەمت، پشتی پێ ببەستە و سووژدە ببە و لێی نزیك ببەوە: ﴿ئەگەر بەندەکانم لەبارەی منەوە لێت بپرسن ئەوا من نزیکم بە هانای نزاگۆیانەوە دەچم کە لێم دەپاڕێنەوە﴾، ئەگەر شادی پێ بەخشیت جا هەر شادییەك بێت، بەوە سوپاسگوزاری دەکاتە بەشت.

خۆشویستنی خۆت

جوانترینی شتەکانت پێشکەشی خۆت بکە و سوور بە لەسەر بەدەستهێنانی باشترین، خۆشویستنی خوود مانای خوودپەسەندی (نەرگسیەت) نییە !



بەڵكوو بە ڕێزگرتنی خۆت دادەنرێت.

## خۆشویستنی هاوڕێیان

جوانترین خۆشەویستییە دەتوانیت بەهۆیەوە بژیت ئەویش خۆشەویستیی هاوڕێکەتە، ئاواتی باشترینی بۆ بخوازیت، خۆشویستنێکی ڕاستگۆیە تا ئەو ئاستەی ئاواتەخوازی ئەوە بیت هاوڕێکەت ژیانێکی هەبێت هاوتای نەبێت، لەجیاتی ئەو ئەزموونی مرۆڤەکان بکەیت و لەنێوانیاندا باشترینی پێشکەش بکەیت.

## خۆشەویستنی دایباب

پێویست دەکات قسەکانم لەبارەی خۆشەویستنەوە بەم بابەتە دەست پێ بکات، هەموومان خاوەنی هەستێن بەرانبەر ئەوانەی هۆکار بوون بۆ گەیشتمان بەو ژیانەی ئێستا تێیداین، بەڵام کەمێکمان بە شێوەیەکی تەواوەتی ئەم خۆشویستنەی بەدی هێناوە.

خۆشویستنیان جوانە، وات لێ دەکات جوانترینیان پێشکەش بکەیت و بیانخەیتە پێش خۆتەوە، جوانە لە ئارامیدا بیانبینیت،





جوانە خۆشت بوێن و قوربانی بە زۆرێك لە شتەکان بدەیت لە پێناویان..

ئەگەر ئەو شتانە وا دەکەن ئەوان هەست بە ئاسوودەیی بکەن.

خوایە، ئەوانم بۆ بهێڵە و من بۆ ئەوان بهێڵە، خوایە.. بە بەختەوەربوونیان خەونەکانم بۆ بەدی بهێنە.

خۆشەویستنی ژیان

لە گرنگترین جۆرەکانی خۆشویستنە، بۆیە هەر بەتەنیا خۆشویستننت بۆ ژیان تێڕوانینت بۆ ژیان پڕ دەبێت لە ئومێد، خۆشەویستنی ژیان بە واتای ئەوەی چاوەڕوانیی زۆرت لێی نەبێت، بۆیە من قەناعەتم بەوە هەیە، کە هەمە!

کەس نییە لە ئێمە ژیان شتگەلێکی جوانی پێشکەش نەکردبێت، بەڵام کەس قەناعەتی بەوە نەهاتووە، کە هەیەتی.

ژیانت سادە بکەوە..

((ئەگەر ژیانت خۆش دەوێت، ئەوا ئەویش خۆشی دەوێیت.))



# کۆڵمەدە

کێشەیەکی گەورە ڕووبەڕووت بووەتەوە، پلان و نەخشەی ژیانتی گۆڕی

ئەمە مانای ئەوە نییە دونیا وەستاوە و گشت شتێك دارماوە.

سەرەتای وەرگیرانم لە زانکۆی ئیمام وام دەبینی ئەمە وێرانکەری یەکەمی هەموو خەونەکانمە، لە ناخی خۆمدا گوتم: ئێستا هەموو خەونەکانم کۆتایی هات! هەر پسپۆڕییەك بێت دەیخوێنم جا بە ئارەزووی خۆم بێت یان نا، لە ڕووی دەروونییەوە داڕووخام! بەڵام دوای ماوەیەك جارێکی بیرم کردەوە.

لە خۆم پرسی: جیاوازیی نێوان وەرگیرانم لە زانکۆی ئیمام و لەگەڵ تەواوی زانکۆکانی دیکە چییە؟

ئایا ئەو پسپۆڕییەی تۆ دەتەوێت لێرە نییە؟

بەڵێ، لەوێ نەبوو، بەڵام پلانی جێگرەوە هەبوو لەسەر بنەمای ئەزموونی پسپۆڕییەکانی دیکە و دوای ئەوە پسپۆڕییەکم دیاری کرد و نەخشەی خەونی تازەم دارشت، ئەوەش پاش ئەوەی کەسێکی داڕووخاو بووم لە وەرگیرانم لەو زانکۆیەی دەمویست، سوپاس بۆ خوا







لەسەر وەرگیرانم، چونکە کاتی تەواوی پێدام بۆ دۆزینەوەی کارامەییەکانم و پڕاکتیزەکردنیان.

با گۆڕینی پلانی خەونەکانمان بکەینە هەلێك بۆ خەونی تازە، خەونێك خوا بۆی هەڵبژاردبین جێگرەوەی پەشیمانی و گلەییکردنە. گۆڕانکارییەکە بۆ من جوانتر بوو، پێویستە هەمووومان ئەوە بزانین هەروەك چۆن دەتوانین لە یەکەمجاردا ئامانج بەدی بهێنین، دەتوانین ئەمە جارێکی دیکە بە داهێنانی زیاترەوە دووبارە بکەینەوە، تەنیا متمانەت بە خۆت هەبێت!



((له توانای داهێنانت دوودڵ مەبە، ناتوانیت وازی لێ بهێنیت تەنانەت ئەگەر ئەوەشت بوێت.))

ڕۆبێرت هێنری

Scanned by TapScanner

# جیاوازییەك بهێنە ئاراوە

بۆ ئەوەی چیرۆکی سەرکەوتنت بە هەموو شانازییەکەوە بۆ ئەوەی دادی بگێڕیتەوە و لەبەر چ شتێکیش تۆ لەوانی دیکە جیاوازیت..

جیاوازییەك بهێنە ئاراوە و پێویست ناکات گەورەبێت، وەرن با لە سادەترین شتەکانەوە دەست پێ بکەین.

جیاوازییەك لە ژیانی ئەوانی تردا بهێنە ئاراوە، بە بڕێکی کەم یارمەتیی خێزانە دەستکورتەکان بدە، لە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی منداڵاندا کاری خۆبەخشی بکە.

خەڵکی لە ئاواتەکانتدا هاوبەش پێ بکە، هانیان بدە تەنانەت ئەگەر بە چەند وشەیەکی سادەش بێت.

بچین بۆ خانەی بەساڵاچووان، وەرن پاڵپشتیان بین، هەست بە گرنگییان بکەین لە ژیانمدا، چونکە ئەوان ئێستا وەك منداڵ وان، لەبەر ئەوە سادەترین شت دڵخۆشیان دەکات.

پێشکەشکردنی هاوکاری لەمیانەی ئەنجامدانی ئەرکگەلێکی سادە دەکرێت جیاوازییەکی ڕاستەقینە لە ژیانی زۆرێك لەو کەس و کۆمەڵگەیانە بهێنێتە کایەوە، کە پێویستییان بە هاوکارییە.

هەمیشە شتە سادەکان دەبنە شتانێکی ناوازە.



# بەختەوەری

چەند جوانە بەختەوەری خستنە دڵی مرۆڤێکەوە!

کە بەختەوەرییان بەهۆی بەختەوەریی تۆوە بێت.

چەند جوانە ئەو بەختەوەرییەی! کاتێك کەسانی دیکە بەختەوەر دەکەین هەستی پیێ دەکەین.

هەموو مرۆڤێك پێویستی بە دەستێکە لە کاتە سەختەکاندا بۆی ببێتە پشتیوان.

سەیری ئەو هەڵوێستە ناوازەیە بکە، جارێکیان هاوەڵێکی پێغەمبەر (سلاوی خوای لەسەربێت) میواندارییی پێغەمبەری کرد و مەبەستی بوو ڕێزی لێ بگرێت و دڵخۆشی بکات، لەگەڵ ئەوەدا خواردنەکەی کەم بوو، بۆیە چرای ماڵەکەی کوژاندەوە و

وا خۆی نیشان دا نان دەخوات تا میوانەکەی لە نان خواردن بووەوە و تێربوو.

قورئان ئەم ڕووداوەی بە دابەزاندنی ئەم ئایەتە پیرۆزە تۆمار کردووە:



﴿کەسانی دیکە دەخەنە پێش خۆیانەوە هەرچەندە خۆشیان زۆر نەدارن﴾

ئەوان برسییەتیی سکی میوانەکانیان دەخستە پێش برسییەتیی سکی خۆیانەوە و کەیفخۆشیی هاوڕێ موسڵمانەکەیان دەخستە پێش کەیفخۆشیی خۆیانەوە، بەوە خۆیان کەیفخۆشییەکی دیکەیان پێ دەبەخشرا، کە بەرزتر و مەزنترە..

کەواتە بەختەوەری گەنجینەیەکە هەمووان بەدەستی ناهێنن، ئەگەر بەدەستت هێنا ئەوانی دیکە بەشداری پێ بکە.

بەختەوەری.. ئەوەیە خۆت بەختەوەر بکەیت تا بتوانیت کەسانی دەوروبەرت بەختەوەر بکەیت.



# بەربەستی هەرە گەورە لە ڕێگەتدا

ژیانمان خاڵی نییە لە بەربەستەکان، بەڵام کەسی زیرەک لە ئێمە ئەوەیە لە هەموویان دەربازبێت بێ ئەوەی بەربەستەکان کاریگەرییان لەسەری هەبێت.

لە هەموو قۆناغێکی ژیانماندا ڕووبەڕووی بەربەست دەبینەوە جا گەورە بێت یا بچووک، هەر چۆن بێت دەتوانیت تێیان بپەڕێنیت، بەڵام بەربەست هەیە ناتوانیت لێی دەرباز بیت، ئەویش ئەوەیە خۆت وا دابنێیت بە بڕوای خۆت دەستەوەستانی بەرانبەری.

بەڵام ئەگەر بڕوات وابێت دەتوانیت و تواناکانت سنووریان نییە، ئەوا دەتوانیت لە هەموویان دەرباز بیت.





((مادام ئاوەز (عەقڵ) دەتوانێت وێنای ئەو حەقیقەتە بکات، کە تۆ دەتوانیت هەر شتێك ئەنجام بدەیت، کەواتە بەدڵنیاییەوە تۆ دەتوانیت ئەنجامی بدەیت.))

**ئارنۆڵد شوارزنجیر**

# قسەی خەڵك بۆ ئێمە هیچ نییە

ئەوەی زۆر ئازاربەخشە ئەوەیە کەسێك هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی ژیانت بە هیچ دابنێت، مایەی پێکەنینیشە ئەو کەسە لە ژیاندا هیچ شتێکی نەکردبێت. هەمیشە لەگەڵ کەسە ئەرێنییەکان بە، ئەو کەسانەی بچووکترین سەرکەوتن لە تۆدا بەدی بکەن دەبێتە شانازی بۆیان، بزانە ئەوانە گەورەترین گەنجینەن لە ژیانتدا و بیانپارێزە.

ئاگاداری ئەو کەسانە بە، کە ڕاوت دەکەن تا بخلیسکێیت و هەوڵ دەدەن خێرا تێکت بشکێنن.

گاڵتەکردنت بە خەونی ئەوانی دیکە ناتکاتە کەسێکی سەرکەوتوو:

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هیچ کۆمەڵە کەسێکتان گاڵتە بە کۆمەڵێکی کەسێکی دیکەتان نەکات ڕەنگە ئەوان لە ئێوە باشتر بن﴾

لەو قەناعەتەدا بە هەموو بڕیارەکانت ڕاستن، جا ئەگەر سەرکەوتیت یان شکستت هێنا.. ئەگەر سەرکەوتیت ئەوە سەرکەوتوویی بڕیارەکەت دەسەلمێنێت، ئەگەریش شکستیشت هێنا ئەوە ئەزموونێکە لە ژیانتدا.

ژیانی ئێمە بۆ ئێمەیە ڕێگە بە کەس نادەین دەستی تێوەر بدات مەگەر بۆ ئامۆژگاری یان ڕەخنەی بنیاتنەر بێت، بۆ هەموانەی





دەیانەوێت شکست بهێنین یان ببینە کەسانێك هیچ مانایەکیان نەبێت، هەموو هەوڵەکانتان بێ سوودە، باشترە سەرقاڵی سەرکەوتنی خۆتان و کاروباری ژیانی خۆتان بن.



((زمانی خەڵك كتێبێكە لەسەر زەوی، خوێندنەوەی فەرامۆش مەكە و
بڕواش بە هەموو ئەوە مەكە، كە تێیدا دەیخوێنیتەوە.))

**سەدام حسێن**

# هاوەڵانی دڵم

ئەو کەسانەن، کە ژیانم بەوانەوە جوانە، ئەوان جوانترین هەبووەکانمن!

سەختترین بڕیار بتوانیت بیدەیت یان سەختترین قۆناغ، کە پێیدا تێپەڕ بیت بریتییە لە هەڵبژاردنی هاوڕێکەت، بە مانایەکی دیکە هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیانت!

بە تێڕوانینی من بە ڕاستی هاوبەشی ژیانتە!

ئامۆژگاری:

بیرۆکەی هاوڕێیەتی لە زۆری ژمارەدا نییە، لە خۆشویستنیان و ڕێگەی بیرکردنەوەیانە،

هاوڕێکەت پێویستە لەگەڵتدا ڕاشکاوبێت، بەڵام نەگاتە بێ شەرمی!

هاوڕێکەت پێویستە گەورەترین هاندەرت بێت، بەڵام ئەمە مانای خۆشدوانی (موجامەلە)ی زێدە نییە!

بیرۆکەی هەبوونی هاوڕێ ئەوەیە بە سروشتی لەگەڵیدا بیت، دانیشتنت لەگەڵیدا ببێتە ئاسوودەیی ڕۆژەکەت، گرنگترین شت ئەوەیە بێدەنگ نەبیت بەرانبەر هەر کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات،



کە هاوڕێتە و لە کاتی پێویستبوونت بە وشەگەلی هاندەر ئەوە دەبێتە گەورەترین تێکشکێنەرت، بە ئەزموون وەرگرتنت لە سەرەتاوە سنووری بۆ دیاری بکە!

بەڵام دواجار ئەوە ڕەت ناکەینەوە زۆرینەی هاوڕێکانمان کەسانی میهرەبانن، لە ژیانماندا هەن.

سەبارەت بە من، سوپاس بۆ خوا، هاوڕێگەلێکم هەن پێم وایە هاوشێوەیان نییە، ئەوان تاقانەن لە جۆری خۆیاندا، ئەوان بەهەشتی ژیانن..



((هاوڕێی ڕاستەقینە وەك پەیوەندیی نێوان دەست و دیدە وایە، ئەگەر دەست بئێشێت دیدە فرمێسك دەڕێژێت، ئەگەر دیدە فرمێسك بڕێژێت دەست بۆی دەسڕێتەوە.))

**ئەحمەد شوقەیری**

# ئیلهامبەخشان

ئیلهامبەخش ئەو کەسەیە زۆرێك لە بەربەستەکانی تێپەڕاندووە و لە ژیانیدا ڕووبەڕووی سەختییەکان بووەتەوە بۆ گەیشتن بە خەونەکەی، ئامانجەکەی، بۆ گەیشتن بە سەرکەوتنە سەرسامکەرەکەی.

پێویستە ئیلهامبەخشێك لە ژیانی هەموو کەسێکدا هەبێت، بۆ ئەوەی، کە ڕووبەڕووی سەختییەکان دەبێتەوە ببێتە هاندەری و تاوەکوو لە ژیانیدا دوای خوا و پێغەمبەری خۆشەویستمان ببێتە باشترین نموونە بۆی.

ئامانج لەوەی پێشەنگێکت لە ژیاندا هەبێت، بۆ ئەوەیە پەرۆشی و پێداگریت پێ ببەخشێت بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی دەتەوێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە تەواو وەك ئەو کەسە بیت، پێویستە لەسەرت تا ڕادەیەك تایبەتمەندیی خۆت هەبێت تا سەرکەوتنی تایبەت بەدەست بهێنیت.

تەنیا ئەوەندە یارمەتیی لێ وەربگرە، کە پێویستە لە ڕێگەی گەیشتنت بە خەونەکەت لەو ڕێگەیەی ئەو ڕووبەڕووی ئەو سەختییانە بووەتەوە، کە لە گەیشتن بە ئامانجەکەی تێی پەڕاندوون، تۆ





پاشماوەی ڕێگەکە بە نەخشەکێشانی خۆت بۆ ئامانجەکەت تەواو بکە و ببە بە پێشەنگ بۆ ئەوانی دیکە.



((کوڕی ئەوە بە دەتویست باوکت وابێت

بێ نیازت دەکات لە سوپاسکردنی ڕەچەڵەك

ڕەسەنایەتیی ڕەچەڵەك بە کەڵکی نایەت

ئەوەی زمانپاك نەبێت و ئاکاری نەبێت

ئەو لاوەی دەڵێت ئەوە منم

وەك ئەو لاوە نییە، کە دەڵێت ئەوە باوکم بوو))

**عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب**

## مافی ئەوەت نییە خراپ سوود لە هەستەکانم وەربگریت!

هەموومان ئەوە دەزانین و بڕوامان بەوە هەیە کەسانێك هەن پێویستە هەستەکانمان بەرانبەریان دەرببڕین، بەڵام بەداخەوە هەندێکیان خراپ سوودی لێ وەردەگرن.

کاتێك هەستەکانمان دەردەبڕین مانای ئەوە نییە ئێمە تەنیا ئێوەمان هەیە یان ناتوانین دەستبەردارتان بین، لەبەر ئەوە دەزانین کەی هەستەکانمان دەربخەین و کەنگیش بیشارینەوە، چاوەڕێی ئەوەش مەکەن هەستەکانمان بەرانبەرتان نەگۆڕێت..

ئەمە مانای ئەوە نییە هەموو وەك یەك بن، بەڵێ هەیە ڕێزی هەستەکانی بەرانبەر دەگرێت، هەیە لە گۆڕانی ئەو هەستانە دەترسێت و هەوڵ دەدات ڕایان بگرێت.

بەڵام دواجار هەستەکانت بە گوێرەی پێویست دەربڕە، تا دوور بکەویتەوە لە هەموو ئەوانەی دەیانەوێت خراپ سوودی لێ وەربگرن.

ئامۆژگاری: پەشیمانی بۆ کاتی لەدەستچوو کاتی لەدەستچووت زیاد دەکات، کەواتە هەوڵ بدە لەجیاتی پەشیمانی وازی لێ بهێنیت.



((ژیان هەمووی ئەزموونە، تا ئەزموونت زیاتر بێت، ئەوا باشترە بۆت.))

ڕاڵف واڵدۆ ئێمرسۆن

## لە گرنگیی خۆت کەم مەکەوە

بە کورتی پێگەت یان کەسایەتیت، تۆ خۆت دەتوانیت لە گرنگیت زیاد بکەیت یان کەمی بکەیتەوە، هەمیشە وا بڕوانە خۆت، کە تەواوی، بەڵام گرنگترین شت ئەوەیە نەگاتە لەخۆباییبوون.

هەمیشە فێر بە خاڵە نەرێنییەکانی کەسوکارت، هاوڕێکانت، خوێندنەکەت، دەستکەوتەکانت لای هەمووان باس مەکە لەبەر ئەوەی لە گرنگییان کەم دەکەنەوە، سەرنجی خەڵکیان بۆ ڕامەکێشە و هەوڵ بدە بە تواناکانت چاکیان بکەیتەوە..

با لەو زۆرانە بین، کە شانازی بە خۆیانەوە دەکەن و با نەنگی و هەڵەکانمان بکەینە هەلێك بۆ فێربوونی تازە، چونکە لە کۆتاییدا ژیانیش وانەیەکە.

کەسە نزیکەکانی ژیانت مەکە جێگەی گاڵتەپێکردنی کەسانی تر، با هەمیشە باسی تایبەتمەندی و دەستکەوتەکانیان بکەین تاوەکوو زیاتر بەردەوام بن، هەتا پتر داهێنان بکەن، بەڵام هەوڵی چاککردنی خاڵە نەرێنییەکانیان بیر نەچێت، وەلێ بە ڕێگەی ئامۆژگاریی خۆشەویستانە، نەك ئامۆژگاریی تێکشکێنەرانە.



((گەشبینی ئەو بڕوایەیە ڕێبەریت دەکات بۆ گەیشتن بە دەستکەوتەکان، هیچ شتێك بەبێ ئومێد و متمانە بە پایان ناگات.))

**هێلین کیلەر**

## گەشتی سەرکەوتن

لە دەوروبەرماندا زۆرێك لە كەسە سەركەوتووە ئیلهامبەخشەكان هەن، كە لە پێناوی سەركەوتن و سەلماندنی خوودا بارودۆخ و بەربەستگەلێكیان تێپەڕاندووە، كە ناكرێت وێنایان بكەیت.

دڵنیا بە هەرچەندە ڕووبەڕووی ڕێگرییەكان بووبێتەوە، جا ڕێگریی ماددی بووبێت، یان ساغلەمی، یان ئەو كۆمەڵگەیەی تێیدا دەژیت، ئەوانەی بەو دۆخە یان سەختتر لەو دۆخەدا تێپەڕبووبن دەتوانن ئومێدت پێ ببەخشن و هانت بدەن، كەواتە بەدوای گرنگترین كەسایەتییە سەركەوتووەكان بگەڕێ و گوێ بۆ چیرۆكەكانیان ڕابگرە.

پێویستە لەسەرت بزانیت ڕوانیت بۆ ئایندەی خۆت چییە و دەتەوێت ببیت بە چی.

باش بزانە لە گرنگترین هەنگاوەكانی بوونە كەسێكی سەركەوتوو ئەوەیە دیاری بكەیت بە كوێ دەگەیت و چۆن دەگەیت؟

جاری بزانە بۆ كوێ دەچیت و ئامانجیت چییە، بۆ ئەوەی لە ناختدا ببێتە هەستێكی مەزن!

كاتێك ئامانجێكت دەبێت هەوڵ بۆ بەدیهێنانی دەدەیت، لەبەر ئەوە هەموو شتێك ئاسان دەبێت.



بە هەموو توانایەکتەوە هەوڵ بدە، کارەکان بە ئاوات خواستن ئەنجام نادرێن، بەڵکوو بە ویست و کۆششکردن پەرجوو(موعجیزە) دەخولقێنین، هیچ بەهانەیەك مەهێنەوە، کە دەبێتە هۆی لەدەستدانی تواناکانت بۆ گەیشتن بەوەی دەتەوێت.

هەموومان هەمان ژمارەی کاتمان هەیە، بەڵام هەمانە بە شارەزاییەوە مامەڵەی تێدا دەکات و هەشە گەورەترین بیانووی ئەوەیە کاتی پێویستی نییە!

بە جوانترین ڕێگە بگە بە ئامانجەکەت، سەرکەوتنت لەسەر بنەمای شکستی ئەوانی تر بنیات مەنێ، بەگوێرەی توانات هاوکاری خەڵك بە، بۆ ئەوەی ئەو کەسە بدۆزیتەوە، کە یارمەتیت دەدات، کاتێك لە ڕێگەی سەرکەوتنت پێویستیت پێی دەبێت، لووتکەی سەرکەوتن جێگەی هەمووانی لێ دەبێتەوە و هەموومان دەتوانین پێی بگەین، بەڵام گرنگتر لەوە ڕێگەی گەیشتنە پێی و پارێزگاری لێ کردنیەتی.





((پاڵەوانان لە هۆڵەکانی ڕاهێنان دروست نابن، پاڵەوانان لەو شتە قووڵانەی ناخیان دروست دەبن ئەوانیش: ویست، خەون، ڕوانینە.))

**محەمەد عەلی کلای**

## سكالا مەكە

یەکێك لەو ڕێگەیانەی زۆرێك لە خەڵك دەیگرنە بەر سکاڵای بەردەوامە.

ئەمەش یەکێك لە گەورەترین هۆکارەکانی شکستهێنانمان!

تاقی بکەوە ڕۆژێك سکاڵا لە هیچ شتێك مەکە، ئەگەر لە کارێکدا خراپەت بینی، هەزار هۆکار هەیە بۆ ئەوەی بە ئەرێنی بۆت بگەڕێتەوە و بە شێوەیەکی گشتی تێبینیی ئەو جیاوازییە لە دەروونت و لەو ڕۆژەتدا دەکەیت.

ئێمە هەمیشە سکاڵا لە سادەترین شتەکان دەکەین، لە بچووکترین گۆڕانکاری لە پلانی گەشت، لە سەختیی ڕێگە، ئەگەر هەموو کەسێك لە ئێمە تێبینی ئەوە بکات دەزانێت ئەمە هۆکاری ئاڵۆزی و تووڕەییە، لەبەر ئەوەی ئاوەز (عەقڵ)مان بۆ تێڕوانین بۆ لایەنی نەرێنی کردووەتەوە.

با هەمیشە کاردانەوەمان ئەوە بێت ئەمە خێرێکە لە لایەن خواوە

﴿لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لە ئەوەدابێت﴾

ئەمە واقیعەکەیە، بەڵام دواجار خوا ژیانمان بەڕێوە دەبات، ئەگەر لە ناخەوە باوەڕمان وابێت خوا ئەوەی نووسیوە و هەر شتێك لە لایەن



خواوە بێت خێری تێدایە بۆمان، تەنانەت ئەگەر شتێکی زۆر سادەش بێت، ئەوە هەر خوودی خۆی دەزانێت لە کوێدا خێری بۆمان تێدایە و تێبینی ئەو جیاوازییە دەکەین لە قبوولکردنی کارەکاندا، من سەبارەت بە خۆم دڵخۆشم و دەزانم خوا ئەوەی خراپە لێم دوور دەخاتەوە.



((بیرکردنەوەکانت بگۆڕە، ئەوکات جیهانیش دەگۆڕێت.))

**نۆرمان ڤینسێنت بیڵ**

## من کێم؟

ئایا دەزانیت تۆ کێیت؟ ئایا دەزانیت تۆ لە کوێی ئەم جیهانە گەورەیەدایت؟

پێویستە لەسەر هەریەك لە ئێمە وەڵامی ئەم پرسیارە بزانێت، هەوڵ دەدەین وەڵامدانەوەکە قایلکەر بێت بۆمان ئەوەندەی دەتوانین..

با لە ئەمڕۆوە لە پێناوی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە کار بکەین، کار بکەین بەوەی خۆشمان دەوێت، بەوەی خەونی پێوە دەبینین، بەوەی دەمانەوێت ئێمە ئەوەبین و کەس ئەو بوونەوەمان بۆ دیاری نەکات، کار بکە و چاوەڕێی هاندەر مەکە، تۆ هاندەری یەکەمی خۆتی.

هەبوونی ئیلهامی کارکردن پێویستە، ئیلهام دەتگەیەنێتە ئەوەی دەتەوێت.

بزانە ئەو وەڵامدانەوەیە تەنیا لە پێناوی تۆدا نییە، بەڵکوو لە پێناوی دایك و باوکتە، لە پێناوی هەموو ئەوانەیە ئومێدی گەورەیان پێتە، با وەڵامەکەت بە جۆرێك بێت لە جێگە نیازباشیی ئەواندابێت.



((هەرگیز چەندێتیی ئەو هێواشییە گرنگ نییە، کە پێی دەڕۆیت، مادام ڕاناوەستیت.))

**پەندی چینی**

## پەیام

پەیامێك بۆ هەموو ئەوانەی وا دەبینن بە بەهای خۆشەویستی کاری دروست ئەنجام دەدرێت..

هیوادارم قسەکە پێتان بگات و بگاتە هەر دوورییەك، کە درۆیە!

پەیامێك بۆ تۆ، پێویستە بزانیت کەس هاوشێوەی تۆ نییە، پێتڤییە بزانیت تۆ کەسێکی ئاسایی نیت تا هەندێك کەس بەدوای جێگرەوەی تۆدا بگەڕێن، بڕوام پێ بکە ئەوەی بەدوای جێگرەوەت گەڕا ئەوە شایانی تۆ نییە.

پەیامێك بۆ تۆ: ((کێ خۆشی ئەوێیت))، پێویستە سەرەتا کەسوکارت خۆش بوێت، پێویستە ڕێزیان بگریت و پێزانینت بۆیان هەبێت و هەر قسەیەك لەوانەوە بوو ئەنجامی بدەیت. بزانە ئەوەی پێچەوانەی ئەوەی کرد، ئەوا هیچ شتێك لە خۆشەویستی نازانیت دەیەوێت ئەوە بکات خۆی دڵخۆش بکات، نەك ئەوەی تۆ دڵخۆش دەکات.

دیسان پەیامێك بۆ تۆ: ئەوەی کە لەگەڵمان دەژیت مەکە بیانوو بۆ ئەوەی لەگەڵمان ئەنجامی دەدەیت، مادام تۆ لەگەڵمان دەژیت یاریی بە هەستی خۆمان ناکەین. مانای ئەوە نییە هەر شتێك بکرێت ڕاستە،

چونکە سنوور هەیە و لە تۆدا ئاوەز (عەقڵ) هەیە و ڕاست لە هەڵە جیا دەکاتەوە، ئاگادار بە لە کۆتاییدا بە ڕوودا نەکەویت.



## ئامۆژگارییەك لە دڵەوە

شانازی بە خێڵ و ڕەچەڵەکتەوە مەکە، چونکە لە سەرکەوتنەکانت زیاد ناکات.

بەداخەوە ڕەگەزپەرستی کۆمەڵگەکانمانی تەنیوە، لە منداڵییەوە لە ناخماندا دەیچێنن، من خێڵەکیم و تۆ نا، من سعوودیم و تۆ هیچ نیت و بەمجۆرە..

ئەوەی ئایینەکەمان و پێغەمبەری خۆشەویستمان فێری کردین لە بیرمان چووەتەوە، خوا هەرچی تێگەیاندبووین بیرمان چووەتەوە.

خوای بەرز و بالاّ دەفەرمووێت: ﴿بە ڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەوەیە زۆرترین لەخواترسانی هەبێت﴾

پێغەمبەر (سلاّوی خوای لەسەربێت) فەرموویەتی: عەرەب لە ناعەرەب باشتر نییە، سوورپێست لە ڕەشپێست باشتر نییە مەگەر بە لەخواترسان نەبێت.

ئەو شتە چییە کە نیشانی بدات ڕەگەزپەرستی لە نێوانماندا هەیە؟ هیچ ئایەت و فەرموودەیەکم نەبینی بڵێت: عەرەب نزیکترە لە خوا یان بیانی! دواجار هەر کەسێك لە ئێمە بە کردەوەکانی لە خوا نزیکە، نەك بە ڕەچەڵەك و نەژادی.



با بە ئاشتی بژین، چونکە هەمووما‌ن لە ئادەمەوە ئافرێندراوین و ئەویش لە خۆڵەوەیە و کەس لە ئێمە لە زێڕ نەئافرێندراوە..

ئامۆژگاریم بۆتان:

کەس بە هۆی خێزان یان ڕەگەزنامەییەوە بریندار مەکە

شتێك مەخە ئەستۆی کەسانێك، کە چاککردنیان بە دەستی خۆیان نییە و لە بنەڕەتەوە نەنگی نییە، بەڵام کۆمەڵگەکانمان بڕیاریان داوە مۆری شوورەییان پێوە بنێن بێ هیچ هۆکارێکی لۆژیکی.

ئامۆژگاریم بۆتان ئەی توێژی ستەملێکراو ئەوەیە گرنگی مەدەن بەوەی خەڵك دەیڵێت.

لە ژیانتاندا کار بۆ خۆتان بکەن، ئێوە لە کەسانی تر باشترن بە سەرکەوتنتان، نەك بە ناسناوتان، خۆتان بسەلمێنن بە عەقڵیەتە ڕۆشنبیرییەکەتان، بە دەستکەوتە جوانەکانتان، کار بۆ ئەو شتە بکەن گرنگترینە، کار بۆ ڕۆژی دواییتان بکەن، کە ستەمی تێدا نییە..





## ژیان بەوجۆرە نییە

ژیان بەو جۆرە نییە، کە دەتەوێت، پێویستە لەسەرت بجەنگیت بەوجۆرەی خەونت بینیوە و هیوات بۆ خواستووە، خەونەکەت بە هەمان شێوەی پلانەکەت نایەتە دی، چونکە ژیانە ئیتر!

پێویستە لەسەرت بجەنگیت جا هەرکێیەک ڕووبەڕووت بووەوە. لە کۆتاییدا بەوە دەتوانیت خەونەکانت بهێنیتە دی، تۆ دەتوانیت بجەنگیت تا دەگەیتە ئەوەی دەتەوێت.

ڕێگرییەکانمان لە ڕووی سەختییەوە جیاوازن.. دەکرێت ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی بریندارکەر و تێکشکێنەر ببینەوە، مەرج نییە ڕەخنەگرەکە نەزان بێت یان پەیوەندییەکی شێواو بەیەکەوە کۆی کردبینەوە، بەڵکوو ڕەنگە کەسێکی خاوەن زانست و ڕۆشنبیریی بەرزبێت و لە نزیکترین کەسەکانمان بێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە ڕەخنەکە ڕاستە و پێویستە بەدوایدا بچین!

بەڵێ، پێویستە ڕەخنە قبووڵ بکەین، بەڵام بە شێوەیەکی دروست، وریا بە لەوەی بیێتە ڕێگرییەک لەبەردەم گەیشتنت بە ئامانجەکەت.

ڕەخنەی بنیاتنەر ڕەخنەیەکە وات لێ ناکات واز لە خەونەکەت بهێنیت، بەڵکوو کەمێک ڕێچکەکەی دەگۆڕێت بە ئاراستەی دروست.



بەلام ڕەخنەی ڕووخێنەر ئەوەیە وات لێ دەکات واز لە هەموو شتێك بهێنیت.

پێویستە لەسەرت جیاوازیی نێوانیان بزانیت و بەرەنگاریی هەموو ئەو ڕێگرییانە ببیتەوە، کە ڕووبەڕووت دەبنەوە و بگەیتە ئەوەی خەونت پێوە بینیوە و شانازی بەو سەرکەوتنەوە بکەیت.



((بە متمانەوە بە ئاراستەی خەونەکەتدا برۆ و بەوجۆرە بژی، کە وێنای دەکەیت.))

**هێنری داڤید سۆرۆ**

# بەنەمەنەکان

ئایا دەزانن دانیشتن لەگەڵیاندا چەند چێژبەخشە؟ لەبەر ئەوەی ئەوان مایەی دڵخۆشیی دونیان.

هەمیشە گرنگی بدەن بە دانیشتن لەگەڵیاندا، ئەوان هەڵگری وانەگەلێکن لە ژیاندا، کە ناکرێت لە جگە لەوانەوە بزانرێن.

ئەوان بە ئەزموونی زۆردا تێپەڕیون وای لێ کردوون ببنە خاوەن پەند، کەواتە سوود لەوە وەربگرە!

ئەگەر ئێستا لەگەڵتدان، سوود لەو هەلە وەربگرە، چونکە زۆرێك لە خەڵك هەن هیواخوازن، کە سکاڵای خەمەکانیان بکەن و لە کاروباری ژیانیاندا ڕاوێژ بە کەسانێکی وەکوو باپیرانمان بکەن، کە خاوەنی پەند و پەرۆشی بن.

من داپیرەیەکم هەیە لێیەوە فێری ئەوە بووم، کە لە هیچ کەسێکی ترەوە فێری نەبووم، فێری کردم و ئامۆژگاری کردم و هەمیشە ئامۆژگارییەکانی زۆر شتی بۆ ڕاست کردوومەتەوە، دەسا خوایە.. تەمەنی ئەو و تەمەنی هەموو ئەوانەی وەك ئەون درێژ بکەیت و دڵخۆشیان بکەیت، چونکە ئەوان لە جێگەی دایك و باوکن.





((لەگەڵیاندا نەرم و نیان بن، چونکە ئەوان لە سەردەمێکی تری جیا لە سەردەمی خۆیانن.))

## بەتەنیا تۆ

بەتەنیا تۆ دەتوانیت ئەوە بیت کە هەیت، بەتەنیا تۆ بڕیار دەدەیت دەتەوێت کێ بیت.

بەتەنیا تۆ هەڵەکانت لە ئەستۆ دەگریت و بەتەنیا تۆ سوود لە سەرکەوتنت وەردەگریت.

تۆی بڕیار لە ئایندەت دەدەیت، جگە لە تۆ کەس بە کارامەییەکانت نازانێت،

بە دەستی خۆتە دەبیتە کەسێکی سەرکەوتوو یان شکستخواردوو.

لۆمەی هەندێک بارودۆخ مەکە، کە تێیدا ژیاویت لەبەر ئەوەی بوونەتە هۆی سەرنەکەوتنت یان لەدەستچوونی خەونەکەت، بەڵکوو بیانکە بە یەکەمین هۆکارەکانی سەرکەوتنت!

بە ئاوات و سەرکەوتنت ژیانت بگۆڕە، ئەگەر شکستت هێنا ئەوە بڕیار دەدەیت شکست بمێنێت یان لە ژیانتدا دەیسڕیتەوە.

بزانە تۆ دەتوانیت هەموو شتێك بکەیت، تۆ کەسێکی گرنگی لەم ژیانەدا، خوای بەرز و شکۆدار هەر مرۆڤێکی بۆ ئامانجێك ئافراندووە، لەبەر ئەوە دەتوانیت گۆڕانکاری لە ژیاندا بکەیت ئەگەر شتێکی سادەش بێت.



((ئەگەر بڕوات وابوو تۆ زۆر لەوە بچووکتریت بتوانیت جیاوازییەک بهێنیتە ئاراوە، کەواتە هەوڵ بدە لە تەنیشتی بۆقێک دابنیشیت))

**پەندی هیندی**

# خەلك دەمار گرە؟

خەڵك هەمووی دەماری کەسەکان دەگرن، بەڵام ئەم دەمارگرییان مەکە بە هەنگاوی یەکەمی شکستهێنانت، وا مەکە لەوەدا سەرکەوتوو بن..

خەڵك دەماری کەسی سەرکەوتوو دەگرن تا وای لیٚ بکەن خراپترین کەسی لیٚ دەربچێت، پاشان دەڵێن ئەوەیە ئاکار و هەڵسوکەوتی..

بزانە ئەوان تەنیا دەماری کەسی سەرکەوتوو دەگرن، بۆیە بەردەوام بە، چونکە تۆ داهێنەری، ئەو کەسانە ناتوانن ئەوە بکەن، کە تۆ دەیکەیت، بەڵام دەتوانن وەك خۆیانت لیٚ بکەن..

کەواتە ئاگادار بە!

پێغەمبەری خوا (سڵاوی خوای لەسەربێت) دەڕۆیشت و پێیان دەوت شێت، دەمارگر، سەرزەنشتکراو، ئەو دەماری نەدەگرتن، بەڵکوو زەردەخەنەی دەکرد و دەیگوت:

((خوایە لە نەتەوەکەم خۆش بە، چونکە ئەوان نازانن))

سەرکەوتوو بە و خۆت بسەلمێنە و ئەو ڕێگەیە بگرە بەر، کە دەتەوێت و وای دەبینیت ڕێگەی سەرکەوتنە و ئێمەش شانازیت پێوە دەکەین.





((چێژی سەرکەوتن ئەوەیە زەردەخەنە بکەیت کاتێك ڕکابەرەکەت چاوەڕێ دەکات بگریت.))

**ویلیام شێکسپیر**

## ئێوە گەورەن

هەر کەسێك بەرپرسیاریەتییەکی گەورەی لە ئەستۆدایە، وەك پەروەردەکردنی برایان بەبێ دایك یان باوك، یا بێ هەردووکیان..

ئەگەر توانیتان ئەو کارە بکەن، ئەوا ئێوە کەسانی خاوەن توانای بەرزن، هەستی باوکایەتی و دایکایەتیتان لە یەك کاتدا بەخشیوە..

دەزانین زۆر سەختە، چونکە تۆش پێویستیت بە سۆز و بایەخپێدان هەیە، پێتڤیت بە کەسێکە بەرپرسیاریەتیت هەڵبگرێت، بەڵام پێویستە بزانیت ئەم ماندووبوونە بێ بەرانبەر ناڕوات، متمانەت بە خوا هەبێت بە شتی جوانتر بۆت قەرەبوو دەکاتەوە.

هەموومان هیواخوازین هەر خزمەتێك هەبێت پێشکەشتان بکەین، بزانن ئێوە لە یادمانن و لە نزاکانمان لە بیرتان ناکەین، ئەوەی ئێستا ئەنجامی دەدەن کارێکی سانا نییە، ئێوە گەورەن.



((هەمووان دەزانن قوربانیدان چییە، بەڵام هەیە قوربانیت بۆ دەدات وەهەیە دەتکاتە قوربانی.))

جاکسۆن براون

## قەناعەت هەبێت

بەداخەوە زۆرێك لە ئێمە هەن قەناعەتیان نییە و زۆرینەیان لە ژیانیاندا شکستیان هێناوە، کە هۆکاری ئەوەش نەبوونی قەناعەت بووە...

چاو تێر نابێت و هەمیشە ئاواتەخوازی زیاترە، پێویستە لەسەرمان فێر بین بەوە قەناعەت بهێنین، کە خوا پێی بەخشیوین. من مەبەستم ئەوە نییە، کەس ویستی زیاتری نەبێت، بەڵام گرنگترین شت ئەوەیە نەگۆڕێت بۆ چاوچنۆکی، وا بیر مەکەوە خاوەنی هیچ نیت تا هەموو ئەوەی هەتە لە دەستی نەدەیت.

پێویستە لە خەونەکانتدا بەقەناعەت بیت، دەزانی بۆچی؟ چونکە هەموو شتێك، کە خەونی پێوە دەبینیت، پێویست ناکات بێتە دی..

قسەکانم دژ نین لەگەڵ ئەوەی سەرەتا گوتم، بەڵام پێویستە لە خەونەکانماندا قەناعەتمان هەبێت، هەر کەسێك خەونێکی جیاوازتری لەوی دیکە هەیە، خەونی ئەوانی تر پێویست ناکات ببێتە خولیای من!

ڕەنگە ژیانت ببێتە خەونێك بۆ کەسێکی دیکە..



با فێر بین تێر بین لەوەی خوای پێی بەخشیوین و سوپاسی بکەین، لەوانەیە ژیان هەموو ئەوەمان نەداتێت، کە دەمانەوێت، بەڵام قەناعەت هەموو ژیانمان پێ دەبەخشێت.



((قەناعەت سامانێکە لەناوناچێت.))

**عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب**

# بەڵێ دەتوانیت

بەڵێ دەتوانیت بەرەو باشتر بگۆڕدرێیت و دەتوانیت باشترین بیت.

دەتوانیت هەموو ئەوە ئەنجام بدەیت، کە خەونی پێوە دەبینیت، تەنیا لەسەرتە بڕوات بەو هەستە هەبێت.

هەموو خەونێك تەنیا بە سامان نایەتە دی و سامان هەموو خەونەکانت ناهێنێتە دی، بەڵکوو بە خواست و سووربوونت دەتوانیت هەموو خەونەکانت بەدی بهێنیت.

کەس لە ئێمە بەبێ توانا لە دایك نەبووە، هەموومان دەتوانین، چونکە کردگارمان یەکە و هیچ شتێك لە بەدیهێنانی خەونەکەت ڕێگریت لێ ناکات، تەنیا متمانەت بە خۆت هەبێت.

با پێشەنگیت و تێڕوانیت بەرەو کەسە سەرکەوتووەکان بێت، بیانکە بە ژێدەری ئیلهامت، دوور بکەوە لە هەموو کەسە تێکشکاوەکان، چونکە ئەوان یەکەمین کەسن وات لێ دەکەن خۆت بە دەستەوە بدەیت.



((ژیانمان ئەوەیە، کە هزرەکانمان دروستی دەکات.))

مارکۆس ئۆریلیۆس

# وزەی ئەرێنی

ئایا دەزانیت چەند جوانە! ئەو بەشێکی زۆر لە ژیانت و ژیانی جگە لە تۆی گۆڕیوە.

وەرە با تاقی بکەینەوە ببینە سەرچاوەی وزەی ئەرێنی لە کۆمەڵگەدا، بەوە دەتوانین بەهێزیان بکەین، متمانەبەخۆبوونیان زیاد بکەین و دواجار ئەم کارە بە باشی بۆمان دەگەڕێتەوە.

تەنیا لەسەرمانە ئاگاداریی دەوروبەرمان بکەینەوە لە جوانیی ئەو شتانەی ئەنجامی دەدەن، شانازی بە دەستکەوتە گەورەکانیانەوە دەکەین، پێیان بڵێن ئەوان کەسانی ئاسایی نین، چونکە ئەوان مەزنن، گووتەیەکی جوان هەیە دەڵێت:

کاتێك بێ بەرانبەر دەبەخشیت، بێ پێشبینیکردن پێت دەبەخشرێت، چەند دەتوانین با ببەخشین.. با ئەوە ببەخشین، کە حەز دەکەین پێمان ببەخشرێت.

کاتێك شتێکی جوان لە ئەوانی تر بەدی دەکەین، پێیان بڵێ.. ساتێك لە کاتت دەبات تا پێیان بڵێیت،

بەڵام ڕەنگە بەدرێژاییی ژیان لەگەڵیاندا بەردەوام بێت.



لە کۆتاییدا ئەرێنی بە و بیرت بێت کەمێك لە گەشبینی

هەزار ڕێگەت بەرەو بەختەوەری بۆ دەکاتەوە.



((سەبارەت بە من، من گەشبینم، لە شتێکی تری جگە لە گەشبینی سوودێکم بەدی نەکرد، کە بۆم بگەڕێتەوە.))

**وینستۆن چەرچڵ**

# ڕۆژێك دێت

ڕۆژێك دێت سەرکەوتنەکانمان دەبینین، هەموو ئەوانەی دەوروبەرمان پیرۆزباییمان لێ دەکەن.

چاو دەدەینە زەردەخەنەی شانازییان بە ئێمەوە..

ڕۆژێك دێت ئەنجامی هەموو ماندووبوونەکانمان دەبینین، ئەوەی چاندوومانە دەیدوورینەوە، دەزانین هەموو خولەکێك، کە لە ماندووبووندا ڕۆیشتووە و سەختترین کاتەکانی بیرکردنەوەمان تێپەڕیوە و لە خەونەوە بۆ کاتوار (واقیع) گۆڕا!

ڕۆژێك دێت شانازی بە هەموو ئەو سەختییانەوە دەکەیت، کە پێیدا ڕۆیشتوویت بە هەموو ساتێکی ئاڵۆزی و دڵەڕاوکێ و ترسەوە، زۆر شانازی بە خۆت دەکەیت بە تێپەڕاندنی ئەوانە.

خۆت بە دەستەوە مەدە، هەموو شتێکی دەوروبەرت بەوجۆرە دەبێت، کە دەتەوێت، خەون ببینە و ڕامەوەستە!

بەڵکوو بەردەوام بە، ڕۆژێك دێت چاوت لە خۆشیدا فرمێسك دەڕێژێت و هەموو یادگارییە ناخۆشەکان دەشارێتەوە و وەك ئەوەی نەبووبن، دەڵێیت کارێکی سادە نەبوو، بەڵام ئەنجامم دا!



((خەونە خۆشەکان بە نەبوونی سەختییەکان نایەنە دی، بەڵکوو بە ڕێکنەخستنیان نایەنە دی.))

**هێلین کیلەر**

# هەڵمەچۆ

لەسەرخۆیی و ئارامی و زەینڕوونی لە بنچینەکانی بڕیاردانی دروستن، پەلەکردن تێیاندا جگە لە پەشیمانی هیچی تری لێ ناکەوێتەوە..

پێویستە هەموومان بزانین ئەو کاتانەی بێ ئاگادارکردنەوەی پێشوەخت دێن چۆن مامەڵەیان تێدا بکەین، پێویستە بە حیکمەتی زیاترەوە مامەڵەی تێدا بکەین، چونکە هەموو ئەو بڕیارانەی بیری لێ دەکەینەوە ڕاست نین!

بەڵێ دەزانم هەندێك شت کە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە زۆر سەختە، بەرگەگرتنی قورسە، بەڵام مەڕووخێ، بەڵکوو بەهێز بە، هەرچەندە دەکرێت کاریگەری لەسەرت هەبێت.

لە کۆتاییدا هەموو ئەوەی ڕوو دەدات تاقیکردنەوەی خوایە، پێویستە باوەڕمان بەوە هەبێت خوا باشترمان بۆ دەنووسێت.

ئامۆژگاری: پێش ئەوەی بە هەر بیرۆکەیەك هەڵبچیت، بەر لەوەی پەنا بۆ هەر کەسێك بەریت!





Scanned by TapScanner

برۆ بۆ لای بەدیهێنەرت، بۆ کێ نووسیبێتی وا دەژییێت، ئەو لە دایکت بەسۆزترە و هەموو شتێک بە دەستی ئەوە.



((کاتگەلێکی بەبەها لە ژیانی هەموو مرۆڤێکدا هەیە، کە تێیاندا بڕیار لە ئایندەیان دەدەن بە سەرکەوتن بێت یان شکست.. مافمان نییە سەرزەنشتی بەخت یان پێگە بێ بەهاکەمان بکەین، بەڵکوو پێویستە سەرزەنشتی خودی خۆمان بکەین.)

**ویلیام شێکسپیر**

Scanned by TapScanner

## هەموو شتێك دەبێت

پێویستە دڵنیا بیت هەموو شتێك ئەگەری ڕوودانی هەیە و مەحاڵە هیچ شتێك کاتێکی زۆر درێژە بکێشێت.

باوەڕمان وایە هەموو شتێك دەکرێت یەکەمین هەنگاوەکانی سەرکەوتن بێت و پاشان کاتی گونجاو بۆ وەدیهێنانی دێت..

ژیانت پشت بە ڕادەی متمانەبەخۆبوونت دەبەستێت

تەنیا سوور بە لەسەری و متمانەت هەبێت دەتوانیت بەدی بهێنیت.

ئەگەر بڕوات وا بووە ژیانت و توانات سنووردارن، زۆر داوای لێبوردن لە خۆت بکە، کە نەتوانیوە شتێك لە ژیانت بگۆڕیت، لە دەرەوەی سندووقەکە بیر بکەوە!

تەنانەت ئەگەر شتێکت بەدی هێنا، دەبینیت تۆ جیاوازییەکی گەورەت هێناوەتە ئاراوە بەوەی تۆ بە جۆرێك هەنگاوت ناوە پێشتر بەوشێوەیە نەژیاویت.



داوای لێخۆشبوون لەو ڕێژە گوناهەت بکە، کە بەرانبەر بەدیهێنەرت کردووتە، چونکە خوا لە سزادان پەلە نەکات و میهرەبانیی ئەو لەپێش تووڕەبوونییەوەیە.

پێغەمبەری خوا (سلاوی خوای لەسەربێت) دەفەرموێت: (هەموو نەوەی ئادەم گوناه دەکەن و باشترین گوناهباران ئەوانەن تۆبە دەکەن.)



((هەوڵ مەدە مرۆڤێکی خاوەن سەرکەوتن بیت، بەڵکوو هەوڵ بدە مرۆڤێکی خاوەن بەها بیت.))

**ئەلبێرت ئەنشتاین**

## ناتوانیت

ناتوانیت خۆشەویستیی هەموو خەڵك بەدەست بهێنیت، چونکە هەندێك خەڵك تەنانەت خۆشیان خۆش ناوێت!

خەڵك لەبارەی هەموو بارودۆخێکی تۆوە قسە دەکەن، سەرکەویت ڕەخنەت لیّ دەگرن، شکست بهێنیت تێکتدەشکێنن..

ئەگەر هیچیش نەکەیت دیسان قسە دەکەن بەوەی هیچ گرنگییەکت لە ژیاندا نییە.

ڕازیبوونی خەڵکی ئامانجێکە نایەتە دی، تەنانەت ئەگەر سووریش بیت لەسەر بەدەستهێنانی، سەیر دەکەیت وا ژیانت ڕۆیشتووە و هیچ شتێکت نەکردووە بۆت بنووسرێت. هەمووی ئەوەی لەسەرتە بەدوای ئەوەدا بچیت، کە خۆشت دەوێت و ئەوەی وای دەبینیت بۆت گونجاوە..

ئەوەی پێویستە ڕازی بێت تۆی، نەك ئەوانی تر، تەنیا دڵنیا بە لەوەی مامەڵەی دروست لەگەڵ هەندێك لە دابونەریتەکاندا بکەیت، تا سەرکەوتوو و جیاواز بیت و گرنگتر ئەوەیە خۆت بیت، نەبیتە کۆپیی جگە لە خۆت.



((گەورەترین هەست لە ژیاندا ئەوەیە شتێك بەدەست بهێنیت، كە ئەوانی تر لەبارەیەوە دەیانوت مەحاڵە))

**واین وایر**

((من بایەخ بە هەموو ئەوانە دەدەم، كە پێیان دەوتم نا، لەبەر ئەوەی بە هۆی ئەوانەوە بە تەنیا خۆم ئەنجامم داوە.))

**ئەلبێرت ئەنشتاین**

## ئێمە لەسەر حەق نین

ئایا دەزانن گەورەترین هەڵە دەیکەین ئەوەیە وەهمی نەخۆشی لای کەسێك دروست دەکەین و وای لێ دەکەین بڕوا بەوە بکات، کە ژیانی کۆتایی دێت. ئیتر ناتوانێت وەك هەر کەسێکی تری ئاسایی بژییێت.

نازانم لەسەر حەقم یا نا! بەڵام بڕوام وایە و تەواو دڵنیام هەندێك لە نەخۆشانی دەروونی دەتوانن باشتر بن، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە وایان لێ دەکەین بڕوا بکەن ئەوان ناتوانن ژیان تەواو بکەن، بۆیە نەخۆشییەکەیان زیاد دەکات، کاتێك هەست دەکەن وەك ئەوانی تر دەتوانن ئەوە بەدەست بهێنن کە دەیانەوێت، ئەمە وایان لێ دەکات بارودۆخیان باشتر بێت و بۆیان دەبێتە خواست و ئامانجێك هەوڵ بۆ بەدیهێنانی دەدەن، یارمەتییان دەدات لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ژیانەی تێیدا دەژین.

با هەستی خۆشەویستیی ژیانێکی جوانیان لا دروست بکەین بە ڕێکخستنی گەشتێکی خۆش، کە سەرکێشیی زۆری تێدا بێت تا بەشدارییان پێ بکەین.. چەند ئاواتەخوازم ئەم هەستە پێشکەش بە کەسێکی خۆشەویستم بکەم!

وای لێ بکەم خاوەنی خولیا و خەونگەلێك بێت، کە پێیان بگات.



((کەس بێ توانا نییە، بەڵام ئەوە کۆمەڵگەیە ڕێگری لێ دەکات.))

**ئەحمەد شوقەیری**

## نیشتمان

گەورەترین شانازی ئێستا هەستی پێ بکەین ئەوەیە ناوی سعوودیەمان هەلگرتووە، ئەو دەوڵەتەی بۆ هەمووان سەلماندوویەتی دەتوانێت ئەوە بکات، کە دەیەوێت، هیچ بوونەوەرێك بۆی نییە دەست لە کاروباری وەربدات.

ولاتەکەم، متمانەی تەواوم هەیە هەموومان بەرانبەر هەر کەسێك دەوەستینەوە، کە دەیەوێت زیانت پێ بگەیەنێت، متمانەی تەواوم هەیە بە بەردەوامی لە پێناوت دەجەنگین.

پاشامان، خۆڕاگر و خاوەن ویست، خودان چاکە و بەخشش، سوپاسگوزاری تۆین، لەسەر هەرچی جوانە و شایستەیە پێشکەشمان دەکەیت، هەموو گەلەکەت بە یەك دەنگ لە ژێر ئالاکەماندا دووپاتی دەکەنەوە: گەورەم، بیستمان و گوێڕایەڵین.

جێنشینی پاشامان، لەگەڵ هەر بەرەو پێشچوونێکی تۆم، کە تۆ دەتەوێت، متمانەم هەیە هەمووان لەگەڵت دەبن. هەموو دژی هەر ئێرەییبەرێك دەستینەوە، باش بزانە ئێمە ئەوپەڕی متمانەمان پێتە، بە بڕیارەکانت، بە کردارەکانت.

هەروەها پشتیوانین بۆ هەر گوفتار و کردارێك دەیکەیت، تەنیا لەسەرتە بجەنگیت و ئێمە هەمیشە لەگەڵتین.





لە پێناوی ئەم نیشتمانە..

بە بەرزاییی ئاسمان شادمان بە، چونکە ئێمە لەگەڵتین و شەرمەزارت ناکەین ئەی سەرکردەی ئیلهامبەخش..



((ئێمە شەڕخواز نین، بەڵام ئەگەر تەپڵی شەڕ لێدرا، ئێمە ئامادەین بۆ شەڕ.))

میر سعوود فەیسەڵ

## خاوەن شوێن دەست بە

چەند جوانە لای هەر کەسێك، کە پێی دەگەیت شتێك جێ بهێڵیت

و

بۆ خۆت بیکەیتە بیرەوەرییەکی جوان!

شوێن دەست، هیچ نییە جگە لە پەنجەمۆری تۆ، بۆ گۆڕینی بیرکردنەوەی هەندێك کەس و چاندنی ئومێد لە ناخیاندا، بەرهەم ئەو شتە مەزنەیە یارمەتیی ئەوانی تری پێ دەدەیت.

زۆرێك لە ژیانماندا هەن بەرهەمیان هەبووە، لەوانە مامۆستا مەها حەقبانی..

ئەم ئەو ئافرەتەیە بێ بەرانبەر ئامۆژگاری و زانیاری پێشکەش کردووین تا باشتر بمانبینێت، ئەو کەسێکە لە هەموو کەسێکدا سووربوون و خەونێکی نوێی زیندوو کردووەتەوە.

ئەو مرۆڤێکە تەنیا بە ئەنجامدانی ئەرکەکەی، کە مامۆستای زانکۆیە، وازناهێنێت.



((ئێمە بۆ مانەوە بەدی نەهێنراوین، با شوێن دەستێکی جوان بۆ گیانمان بەجێ بهێڵین یاد بکرێتەوە، با وەك باران بین لە هەر کوێ بێت بۆی گونجاوە.))



((ببه نموونه بۆ ئەو شتە دەتەوێت ببینیت لە جیهاندا بڵاو دەبێتەوە.))

**ئەلبێرت ئەنشتاین**

((ڕۆژانێکی خۆش بۆ خۆت بسازێنە، چاوەڕێی جوانیی ڕۆژەکانت لە کەس مەکە.))

**جوبران خەلیل جوبران**



((هەژارترین کەس ئەو کەسە نییە، کە نەتوانێت سامان بەیەکەوە بنێت، بەڵکوو کەسێکە نەتوانێت خەونی هەبێ.))

**دێڤید**



((ئەگەر بەربەستەکان نەبن، پاڵەوانییەتییەکانیش نابن.))

**ئۆپرا وینفری**



((لە جوانترین قەرەبووکردنەوەکانی ژیان ئەوەیە ناتوانین یارمەتیی کەسێکی تر بدەین، بێ ئەوەی یارمەتیی خۆمان بدەین.))

**ڕاڵف واڵدۆ ئێمرسۆن**

((شێتی ئەوەیە هەمان شت دوابەدوای یەك ئەنجام بدەیت و چاوەڕێی ئەنجامی جیاواز بیت.))

**ئەلبێرت ئەنشتاین**



((ئێمە هەمیشە هەوڵ دەدەین کارەکان وا ڕاڤە بکەین بەوجۆرەی دەمانەوێت، نەك بەوشێوەیەی خۆی هەیە.))

**پاولۆ کۆیلۆ**

((سوپاسگوزار بە بەرانبەر هەر شتێك لە ژیانتدا دەڕوات، لەبەر ئەوەی هەر شتێك، کە ڕوو دەدات لە لایەن خواوە ئاماژەیەکی بۆ تۆ لەخۆگرتووە.))

**جەلالەددین ڕۆمی**



((ئەگەر توانیت ڕێگەیەکی بێ بەربەست بدۆزیتەوە، ئەوە بە ئەگەرێکی زۆرەوە ناتگەیەنێتە هیچ جێگەیەک.))

**فرانك كلارك**

((لە کەسە نەرێنییەکان دوور بکەوە، ئەوان بۆ هەموو چارەیەک گرفتێکیان پێیە.))

**ئەلبێرت ئەنشتاین**



((پێویستە ئەوە بزانیت تۆ کەسێکی دانسقەی بێ هاوتای لەم جیهانەدا.))

**واین دایر**

((کاری مرۆڤ سەیرە، کار بۆ دونیا دەکەن و بێ کارکردن تێیدا ڕۆزی دەدرێن، کار بۆ ڕۆژی دوایی ناکەن، کە هیچیان پێ نابەخشرێت تەنیا بە کردەوەکانیان نەبێت.))

**خالیدی کوڕی سەفوان**



((ئەگەر ڕابردوو شایانی قسەکردن نییە، با ئایندەیەك بنیات بنێین شایستەی گێڕانەوە بێت.))

**نەجیب مەحفووز**

((بەهێزەکان ئەوانە نین هەمیشە دەبەنەوە، بەهێزەکان ئەوانەن لە کاتی دۆڕانیان کۆڵ نادەن.))

**محەمەد عەلی کلای**



((لە ژیاندا ئەگەر لە لێدانی یەکەمەوە فێر نەبوویت، کەواتە شایانی لێدانی دووەمیت.))

**مارتن لۆسەر کینگ**





# خۆت بە

خۆت بە، وا بە کە دەتەوێت وا بیت، وا بە وەك ئەوەی دەیبینیت ئەمە پێویستە وا بێت، بەو جۆرەی تۆ پێی ڕازیت.

نە لە شیانی خۆت کەم بکەوە نە لە توانای خۆت، بزانە تۆ دەتوانیت زیاتر ئەنجام بدەیت، تەنیا هەلێك بە خۆت بدە بۆ کردنی کارێکی ئەستەم..

((خۆت بە کۆپیی جگە لە خۆت مەبە))

لێرەدا لە کتێبەکەمدا هەموو هەستەکانم لە نووسیندا لەبارەی دڵتەنگی، شادی، دڵنیایی، پەشیمانی ..دەخوێننەوە. هەوڵم داوە ئەوەتان پێ ڕابگەیەنم، چۆن لەو شتانەی ڕووبەڕووم بوونەوە فێربووم، ئەمە مانای ئەوە نییە ڕێگەکەم ڕاستترینە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەکەم ڕاستە.

# بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕەها

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | ئیسلام یان ئیلحاد | و/ ئەیاد نادر |
| ٢ | جوانتر بیربکەوە | سبحان سەید |
| ٣ | دێڕی نامەکان | تەنیا محەمەد |
| ٤ | کچی کافرۆش | هێدی سەلیم |
| ٥ | هونەری جەنگ | ن/ سون تزو<br>و/ نیاز مەستی |
| ٦ | پیانۆ | ن/ ڕۆزمێری بۆردەر<br>و/محمد جەمیل عەلی |
| ٧ | عاشقانە دێم | زامدار قادری |
| ٨ | چیرۆکی ڕەوشتە باڵاکان | محمد کەریم حاجی |
| ٩ | ئایا دەکرێ خوێن درووست بکرێ؟ | ئەحمەد محەمەد ئەقاش |
| ١٠ | پوختەیەك لە ژیاننامەی زانا و پیاوچاکانی کورد | زانا هەرەدانی |
| ١١ | ستیف جۆبز کێ بوو؟ | ن/ پام پۆلاك و مەگ بەلفسۆ<br>و/ ڕەوەند حەکیم |
| ١٢ | بەختەوەرترین ئافرەت لە جیهاندا | ن/ عائض القرني<br>و/ نیاز مەستی |
| ١٣ | پوختەیەك لە ژیانی عەلی کوڕی حوسێن (زین العابدین) | عبدالرحمن محمدامین |
| ١٤ | ماهی نوورین | هێدی سەلیم |
| ١٥ | ئەبولحەسەنی ئەشعەری ( قوتابخانە کەلامی و فەلسەفییەکەی) | عەدنان ئەمین |
| ١٦ | ئەتەکێکی قسەکردن | ن: د: ئیهاب فکری<br>و/ دەشتێ تالیب شوانی |
| ١٧ | ١٠١ کۆدی بەرپەرۆسا | ن/ جیهاد الترباني<br>و/ ئەحمەد حمدامین مەنتك |
| ١٨ | فیقهی سانا | خ.ڕەشید ڕەحیم |



| | | |
|---|---|---|
| | | نیاز مەستی |
| ١٩ | لابردنی گومانەکان لەسەر ئاهەنگگێران بە بۆنەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەرمان | م. جاسم کەرکووکی |
| ٢٠ | لا یأتیه الباطل | ن/ محمد سعید رمضان البوطي<br>و/ محەمەد مەلا سعدالدین |
| ٢١ | ١٠١ چیرۆکی سەرسوڕهێنەر | ڕەوەند حەکیم |
| ٢٢ | ئامۆژگاری باوکێك بۆ ڕۆڵەکەی | ن/ ئەشرەف عوسمان<br>و/ ئەیاد فەهمی |
| ٢٣ | تاوانە دەروونییەکان | ن/ محمد سعید رمضان البوطي<br>و/ عومەر ڕێشاوی |
| ٢٤ | بەیانی جوانتر دەبێت | ن/ عبدالله المغلوث<br>و/ موحسین ئەمین |
| ٢٥ | گەورە بژی | ن/ کەریم شازەلی<br>و/ نێچیروان جاسم وەلی |
| ٢٦ | پەروەردەی ژیرانە | ن/ کەریم شازەلی<br>و/ هندرێن هەژار |
| ٢٧ | درەختی گەردوون | ن/ محی الدین ابن عربی<br>و/ یاد نووڕسی- بوشرا خۆرانی |
| ٢٨ | ژیانەوەی دڵەکان | ئەحمەد محمد سەعید |
| ٢٩ | ڕێبازێکی پەروەردەیی تاقانە لە قورئاندا | ن/ محمد سعید رمضان البوطي<br>و/ عومەر ڕێشاوی |
| ٣٠ | بیرکردنەوەت بگۆڕە ژیانت بگۆڕە | ن/ برایان ترێسی<br>و/ داستان شەریف |
| ٣١ | ١٠ خاڵ پێشچوونە زانکۆ | ن/ یاسر عبدالکریم بکار<br>و/ ڕەوەند حەکیم |
| ٣٢ | چیرۆکەکانی ژیان | ن/ عەلی تەنتاوی<br>و/دیار ئیبراهیم سەنگەسەری |
| ٣٣ | زمانی دووەم | نەهرۆ جەرجیس |
| ٣٤ | سڵاوت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خوا | ن/ موستەفا حوسنی<br>و/بەسام مەحمود |



| | | |
|---|---|---|
| ٣٥ | فێربوونی فەڕەنسی | بابان عەلی مەحمود |
| ٣٦ | فەرهەنگی دەرمان | ئەحمەد گوڵ |
| ٣٧ | دوایین پیاوی ئەندەلووس | زامدار قادری |
| ٣٨ | لەگەڵ خەڵکدا | ن/ عەلی تەنتاوی<br>و/ ئەیاد فەهمی |
| ٣٩ | مرۆڤ و دادپەروەری خودا لە زەویدا | ن/ محمد سعید رمضان البوطي<br>و/ عومەر ئەحمەد نیزامی |
| ٤٠ | نزاکانی مەولانا | کۆساران ئەحمەد |
| ٤١ | ڕەوشتی گفتوگۆ لە قورئانی پیرۆزدا | ن/ محمد سعید رمضان البوطي<br>و/ ئەمجەد تەهاوی |
| ٤٢ | یادی پیاوچاکان | ن/ عەتتار نەیشاپووری<br>و/ کۆساران ئەحمەد |
| ٤٣ | ١٠١ کۆدی ئاریۆس | ن/ جیهاد الترباني<br>و/ ئەحمەد حمدامین مەنتك |
| ٤٤ | ئەوروپا لە تەکنەلۆژیاوە بەرەو ڕۆحانییەت | ن/ محمد سعید رمضان البوطي<br>و/ دیار ئیبراهیم سەنگەسەری |
| ٤٥ | پەندەکانی سەعدی | ن/ غوڵامرزا سەوالونی<br>و/ مەهدی عەبدوڵڵا |
| ٤٦ | سەعدی ( شاعیری عیشق و ژیان) | ن/ د.مەنوچەهر دانش پژوه<br>و/ مەهدی عەبدوڵڵا |
| ٤٧ | خاڵبەندی<br>ڕێساکانی بەکارهێنانی بە نووسیندا | جووتیار قارەمان |
| ٤٨ | جلاء الخاطر بە کوردی | ن/ شێخ عبدالقادر گەیلانی<br>و/ عبدالرحمن محمد امین |
| ٤٩ | فیزیایی بەختەوەری | ن: سەعید نوبان<br>و: ئەیاد فەهمی |
| ٥٠ | ٤ شەقامی سەرکەوتن | ن: د. ئیهاب فکری<br>و: مەحمود یاسین |
| ٥١ | دوکانی خۆکوژی | ن: ژان تووڵێ<br>و: هەدیە عەلی |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٢ | ماچی یەکەم | ن: کەریم کاکە |
| ٥٣ | ڕووی نازەنینی خودا ماچ کە | ن: مستەفا مەستوور<br>و: بێژەن تۆفیق |
| ٥٤ | دەرگاکانی میهرەبانی | ن: وەسیم یوسف<br>و: کامەران عومەر |
| ٥٥ | موریدی حەزرەتی پەروانەم | زامدار قادری |
| ٥٦ | خۆت بە | ن: لەمیا ئیبراهیم هومەیل<br>و: نێچیروان جاسم وەلی |

# خۆت بە

خۆت بە، وا بە کە دەتەوێت وا بیت، وا بە وەک ئەوەی دەیبینیت ئەمە پێویستە وابێت، بەو جۆرەی تۆ پێی ڕازیت.

نە لە شیانی خۆت کەم بکەوە نە لە تواناى خۆت، بزانە تۆ دەتوانیت زیاتر ئەنجام بدەیت، تەنیا هەلێک بە خۆت بدە بۆ کردنی کارێکی ئەستەم..

((خۆت بە کۆپیی جگە لە خۆت مەبە))

لێرەدا لە کتێبەکەمدا هەموو هەستەکانم لە نووسیندا لە بارەی دڵتەنگی، شادی، دڵنیایی، پەشیمانی.. دەخوێننەوە. هەوڵم داوە ئەوەتان پێ ڕابگەیەنم، چۆن لەو شتانەی ڕووبەڕووم بوونەوە فێربووم، ئەمە مانای ئەوە نییە ڕێگەکەم ڕاسترینە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەکەم ڕاستە.

Cover Design: **Bassam Mahmoud** (@bassamart10)





هەولێر، بازاڕی ڕۆشنبیری، تەنیشت پارێزگا

+964 750 406 6674

Nawandi Raha ناوەندی ڕەها


